چەپکی دووەم لە

# دیوانی نوری

شێخ جەلالی شێخ جەمیلی نەقشبەندی

١٩٨٥

لە بڵاوکراوەکانی ئەمیندارێتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان

چەپکی دووەم لە

# دیوانی نووری

شێخ جەلالی شێخ جەمیلی نەقشبەندی

[illegible] ١٤٤١ ساڵی ١٩٨٥

# ووشەیەک

ماوەیەک لەمەوبەر سیمینارێکی گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان کۆمەڵە شیعرێکی بە ناوی (چەپکە شیعرێک لە دیوانی نووری) بۆ چاپ کردم و ئەم کارە بەرهەمی ئەو سیمینارەیە جێگەی سوپاس و ستایشی مە بوو.

ئەوەی شایەنی باسە ئەو هۆنراوە هەمەجۆرانەی کە لە گشتییەکەدا بڵاوکرابوونەوە لەموو شیعرەکانی مە نەبوون ، چونکە مە جگە لە وەرگێڕانی سەرپاکی (مەسنەوی) یەکەی جەلالەدینی ڕۆمی ، دیوانێکی گەورەی شیعریشم داناوە ، وا بوو هەندێکیان بڵاوکرایەوە وئێستا بە هیممەت و یارمەتی لەماوە سیمیناری گشتی هەندێکی تری لێ بڵاودەکەمەوە وئێستەکی سوپاسی هەستی بەرزی و یارمەتی دانیان دەکەم .

خوێنەرەواری بەڕێز :

ئەوەی لەم بەشەدا بەرچاوت دەکەوێ کۆمەڵە شیعرێکی هەمەجۆرە لە شیعری ئایینی و وەصفی کوردستان وشیعری دڵداری وشیعری پەند و ئامۆژگاری کۆمەڵایەتی و ، چەند

هەڵبەستێکیشم لە تورکی و فارسی کردووە بە کوردی .

هەرچەندە لە بەشی یەکەمی دیوانی شیعرەکانیشم دەستم بۆ ئەو ڕاستییە درێژ کردووە ، کە لە سەرەتای شیعردانانم دا شیعرەکانی نالی و کوردی و تایەربەگی جاف و بێخودی ئوستادی شیعرکاریان کردوەتە سەرخۆشی و سیرم و بەرەو دنیای شیعریان بردووم ، ئێستاش دەڵێم جگە لەمانە حەلقی تیسی دەورێکی زۆری بووە لە تەقینەوەی بەهرە و توانستی شیعریم .

## تۆماری ژیانم لە چەند دێڕێکدا

- ناوی تەواوم جەلال شێخ جەمیل شێخ شاکری نەقشبەندییە .
- لە تەمەنی شەش ساڵیدا چوومەتە قوتابخانەی سەرەتایی هەولێر تا پۆلی چوارەمی (سانەوی) م هەر لەو شارە تەواو کردووە .
- خوێندنی ئامادەییم لە قوتابخانەی ئەمریکییەکانە لە شاری

بەغدا تەواو کردووە .

- لە ساڵی ١٩٢٦ دا بۆ یەکەم جار بووم بە فەرمانبەر .
- لە ساڵی ١٩٢٧ دا بووم بە سکرتێری ئاو و کارەبای هەولێر و لە دوایشدا بووم بە یاریدەدەری ژمێریاری شارەوانی هەولێر .
- لە ساڵی ١٩٥٩ وە تاکوو کۆتایی ١٩٦٠ کراوم بە چاودێر لە دایرەی ئینحصاری تووتن لە رەواندز .
- لە دوا دوای ساڵی ١٩٦٠ دا گوێزراومەتەوە بۆ ئینحصاری هەولێر .
- لە ساڵی ١٩٦٣ دا کراوم بە بەڕێوەبەری بەرژەوەندی ـ هاتوچۆکران هەر لە شاری هەولێر .
- لە ساڵی ١٩٧١ دا لەسەر داوای خۆم خانەنشین کراوم
- لە ساڵی ١٩٧٥ دا بۆ ماوەی سێ ساڵ کراوم بە ئەندام لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی یاریگای هەولێر .

شێخ جەلال شێخ جەمیل
(نووری)

# سەرگوزەشتەی ژیانم بە شیعر ...

یەکەم بە ناوی جەنابی باری
ئەقڵ ئاگاتە کردەوەو کاری

دووەم بە ناوی خۆشەویستمان
زاتی موحەممەد حەبیبی یەزدان

دێمە سەرباسی درەختی ژینم
بەیانی دەکەم باوەڕو دینم

ئیسلامی پاکە بڕواو ئایینم
قورئان موعجیزەی ڕاستو یەقینم

جەلال ناومە نازناوم نووری
شێخ جەمیل باوکم کوڕی شاکری

محەممەد سەعید باپیری باوکم
لە هەمان کاتدا باپیری دایکم

دوای ئەمە دەڕۆم بۆ دووپشتی تر
لەمە زیاتر نازانم پتر!

شا ئیسماعیلی بە دین وتەقوا
باوکی جەنابی هیدایەتوڵڵا!

باوکی ئەویشیان شێخ عەبدولکەریم
هەندە دەزانم والێرە نووسیم

چەندسەد ساڵە واخانەوادەی مە
نەتەوەی کوردین هەولێرجێگای مە

مەنسووبی پیری شاهی نەقشینە
تیرە بە تیرە مەحسوبی وینە

دانیشتووی جێگەی مەولانا خالید
بۆمەی بەجێ هێشت ئەوزاتەی زاهید

بینای خانەقای زۆر بە پەرۆشی
بۆی تەواوکردین بەکەیف خۆشی

دووسەدوسیی بوو لە پاشی هەزار
مێژووی خانەقا دەرچوو بە ئەژمار

ئەهلی نەجیبی هەولێری دێرین
ڕێزمان لێ دەنێن لەناو ئەهلی دین

کە بوومە شەش ساڵ چوومە بەرخوێندن
کەوتمە کۆشش و دەرس لەبەرکردن

ڕۆژ بە ڕۆژ خوێندم تا شەشم بڕی(١)
بە هەوڵ و کۆشش زانستم کڕی

چوومە قوناغی خوێندنی ناوەندی
خوێندم هەتاکوو هیوام هاتە دی

تا پۆلی چوارەم لە ئامادەیی
بەکۆششی خۆم بە ئامادەیی

له شاری هەولێر تەواوکرد ئەمجا
بۆ خوێندن چوومە شارەکەی بەغدا

له خوێندنگاکەی ئەمریکایی یەکان
دەرچووم کەوتمە مەیدانی ژیان

بووم بە فەرمانبەر لە ئیشی میری
لە بەرزەوەنڕی بووم بە مودیری(٢)

هەشت ساڵی تەواو بەڕێوەبەر بووم
بۆ سوودی خەڵقی هەرتێکۆشەر بووم

عارەبی و تورکی وکوردی زمانم
ئینگلیزی و فارسی کەمێك دەزانم

خەڵکینە ئەمڕۆ ئەم بەشەی دیوان
پێشکەشی دەکەم بە قەومی کوردان

بۆ ئەو کوردانەی کە لێ قەوماون
زەبوون و بێکەس پەرێشان ماون

---

(١) مەبەستی لە قۆناغی سەرەتایی یە.

(٢) مەبەستی لە بەڕێوەبەری بەرژەوەندی هاتوچۆکرانە.

# جەژنی لە دایک بوونی پێغەمبەر

دەرگەیی رەحمەت کراوە چونکە حیکمەت لێرەدا
زاتی ئەحمەد هـاتە دنیا کائیناتی شوعلەدا

توررەیی خەتمی ریسالەت وا لە شانی بووظهوور
پرتەوی نووری هیدایەت پەرت بوو لەم دنیایەدا

تێکەڵە ناوی پیرۆزی وا لە گەڵ ناوی خودا
شاهیدە روکنی شەهادەت لەم کەلامەی خۆشەدا

دوازدەمینی رۆژی ئەو مانگە رەبیعولئەوەلە
گەوهەری تاجی ریسالەت بوو لە داك لەم رۆژەدا

سەرنگوون بوو بووت و ئەصنام قەدر و قیمەتیان نەما
چونکە دینی پاکی تاها بوو ظهور لەو وەقتەدا

یەک لەگەڵ ناقووس ئەویتر بە تەکبیر بانگ دەدا
دەنگەکەی «الله اکبر» چەند خۆشە لەم گوێیەدا

گشتی دینی ئەم جیهانە ئاشکرا نین روحەکەم
دینی ئیسلام ئاشکرایە وا لە مەیدانی خودا

مەدحی ئەو باری تەعالا وا بە لەولاک کردووە
خۆشەویستی زاتی یەزدان وا جەنابی ئەحمەدا

دووڕ هەرچەند مەدحی ئەو زاتە بکەم واهەرکەمە
چونکە نووریکە موحەممەد وا لە نێو نووری خودا

دەرگەی حەق بۆ گوناهکاران جێگای ڕەحمەتە
گەر لە ئەو دەرگا بەری بێ کامە دەرگا لێدە دا

چاك دەزانێ غەیری دەرگای مستەفا دەرگا نیە
چونکە ئەم زاتە «شَفیعُ المذنبینَ»ە لای خودا

شیعرەکەت بۆ ئەهلی تەقوا نوورە (نووری) لێرە دا
دوورڕوو [illegible] لەم شیعرەدا

# ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز

ئایەتی قورئان کە دڵ واپێی خۆشە
شەش هەزارو شەش سەدو شێستو شەشە

یەك هەزاری پەندو وەعزو ئیعتبار
یەك هەزاری سەرگوزەشتەی بێ ژمار

یەك هەزاری وەعدە، وا یەك هەزاریشی وەعید
یەك هەزار ئەمرو، هەزاریش نەهی و تەهدیدی شەدید

پێنج سەدی بەحسی حەلال و هەم حەرام
سەد لەوان تەسبیحی ویردی صوبح و شام

# شەست وشەشیان گشتی مەنسوخە لەوان خوای (تبارك) ئەعلەمە زۆر چاك بزان

---

● لەبارەی فێربوونی زانیاری بەتر لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە لەم ژمارانەی خوارەوە وورد بەرەوە :

(١٩٣٠٤) ووشەکانی قورئان

(٦٦٦٦) ئایەتەکان

(٧٢٢٣٤٢) ژمارەی پیتەکان

(١١٤) ژمارەی سورەتەکان

●● لەبارەی زانیاری کتێبە پیرۆزەکانی تەورات وئینجیل و زەبووریش ئەم زانیاری یانەش بزانە :

(٤٠٢١) ژمارەی أصحاحی تەوراتە کە بۆ حەزرەتی موسا نازل بووە .

(٨٤٠٠) ژمارەی ئەصحاحەکانی ئینجیل کە بۆ حەزرەتی عیسا نازل بووە .

(٨٠٠) ژمارەی مەزموورەکانی حەزرەتی داود .

# لە ستایشی پێغەمبەردا (١)

موعجیزەت قورئانە قوربان ئەی شەفیعولموزنبین
چاپی کرد تەجویدی (مەسعوود) بوو بە مەسعوودی خودا

من لە ئەووەل تاکو ئاخیر یەک نەزەر ورد بوومە لێی
رەخنەییکم لێ نەدی سەد ئافەرین لەم سەعی یەدا

چاپی کوردستان لە چاپی داوە ئەم تەجویدە وا
خاوەنی (گیو) ە بەشێکی باشی بوو لەم خێرەدا

---

(١) ئەم هەڵبەستە هەموی حەوت دێرەو لەبارەی کیتێبەکەی تەجویدی (مەلامەسعوودی بێ بەش)ە و اباوەمو لە بەشی یەکەمی ئەم دیوانە دێری یەکەم و دووەم و سێیەم و حەوتەمیم لێ بڵاوکردوتەوە ، وا لێرەشدا دێری چوارەم و پێنجەم و شەشەمی لێ چاپ دەکەین .

# چەند شیعرێکی تاک تاکی ئایینی

گەر خودا رەحمی بە عەبدی خۆی بکا
وا بە شەو باران دە بارێنێ ، بە رۆژیش خۆش دەکا

- ئەم تاکە شیعرە وەرگێڕدراوی فەرموودەیێکی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ (اذا اراد الله خيراً بأمة امطرهم ليلاً واصحاهم نهاراً)

## مردن

چەند بژی ئینسان والەم جیهانە
ئەنجامی ژیان هەر دەم نەمانە

## ○ سزا دان ○

بە گوێرەی کردەوەی ئینسان
ئەگەر بیدا سزا یەزدان
ئومێدت ببڕە ئەی غافل
جهەننەم جێتە بۆلێدان

## ○ ئەی میوان ○

ئەی میوانی خاوەن نەفەس
وەی حەریسی دنیای ناکەس
دەزانی نامێنێ هیچ کەس
غەیرەز یەزدانی بەرز و بەس

---

● پارچە شیعرێکی فوئاد پاشایە لە تورکی یەوە کردوومە بە کوردی چوارینی یەکەمی لە بەشی یەکەمی ئەم دیوانەدا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لێرەدا هەڵبەستەکە هەمووی بە سەریەکەوە بڵاودەکەینەوە ؟

هەرکەس دەمرێ بە دەردێکا
چ لە ناوجێ چ لە رێگا
سوودی نییە هەرچی بکا
هەندە نایێ دونیای نەفەس

---

منیش فوئادی عەصری بووم
جێگەنشینی صەدری بووم
خاوەنی کورسی وقەصری بووم
عەکسی کرد لێم چەرخی عەبەس

---

نەخۆش کەوتم موددەتێک وا
تەن بە تەدریجی تاواوا ،
فڕی تەیری گیان بۆ هەوا
چونکە تێکوپێک چوو قەفەس

کوژاوە واچرای خۆشی
تاریکی گشت دنیای پۆشی
قیامەت ڕۆنی کرد ڕۆژی
لە نووری یەزدان موقتەبەس

---

دۆزیمەوە یەزدانی خۆم
عەزم کرد وا عوصیانی خۆم
تکاو کرد بۆ غومزانی خۆم
ڕەحمی بکا کەسی بێکەس

---

(نووری)م عەبدێکی ڕوو ڕەشم
مەنوارە کردەوە و ئیشم
لە عەفوت بمدەری بەشم!
پەنام بردە دەرگاهت بەس

# مەثنەوی (1)

بەیاریدەی ئەوەی تەنهاو تاکە
لە هەر ئیشێك مونەززەهەو هەم پاکە

وەرگێڕا بەکوردی مەثنەوی وا
نەبوو چونکە بەکوردی ئەی براکە

خەریکی بووم شەوو ڕۆژ من هەمیشە
تەواوم کرد لە سایەی خوا بەچاکە

ئەوی ئەوگەوهەرەی دەخوێنێ زاتی
پڕی حیکمەت هەمووی دوڕڕی ڕووناکە

ئەوا بۆ ڕۆڵەکانی کوردی گوردم
دەکەم پێشکێش هەموو ئەو دوڕڕە پاکە

به نووری حەق دڵی (نووری) کە ڕۆن بوو
خودا نوورت لە بۆ هەرکەس بڵاوکە !

(١) نووری ئەم پارچە هەڵبەستەی بۆ پێشەکی مەثنەوی جەلالەدینی ڕۆمی داناوە کە هەمووی بە پەخشان کردووە بە کوردی و ئامادە یە بۆ چاپ کردن .

* * *

# شاری دەرسیم

کوردە شارەکەی دەرسیمم دەرسیم
تا ئێستا کامتان لە حاڵتان پرسیم ؟

ئەوا دەمێکە لە دەست بێگانەم
نامەوێ بژیم بەم نەوعە مانەم !

رۆڵەی خۆتم وەرە فریاکەم ،
زنجیری دیلی تەحەمول ناکەم

هەرگەلێک بێ شک مافی خۆی وەرگرت
تەنها قەومی کوردچی لە دەست نەکرد

لە دەستی تورکان زەمانێ ماوم
شاری کوردانم والی قەوماوم

کوردی سوریاو تورکیاو ئێران
کەی سەربەست دەبن لە خاکی خۆیان ؟

خوایە ببینم کوردی کوردستان
وەك کوردی عیراق بێ ژیانیان

## ○ بەهاری کوردستان ○

لەوەرزی خۆشیی بەهار،
لە ناو مێرگ و مێرغوزار

بنەوشە و سوسن و هەڵاڵ
گوڵی سپی و زەرد و ئاڵ

تێکەڵاون هەموو ڕەنگ
پێی گەش دەبێ دڵی تەنگ

کوردستان وەك بەهەشتە
هەمووی گوڵزار و دەشتە

دیـــمەنی ڕەنگاو ڕەنگـە
سـەیرانگای شۆخ و شەنگـە

لەلایێ جۆگـەی ئاوە
ڕوون وەك ئەسرێی چاوە

لەلایێ غونچـەی گوڵـە
جێـی چەهچەهەی بولبولە

هـاژەی قـەڵبـەزی ئاوە
مـایەی ڕوونـاکی چـاوە

چـەند سـاردو سازگارە
دەوروپشـتی گـوڵـزارە

هەمووی چیمەنی سەوزە
بەهار خۆشترین وەرزە

بۆ کوێ دەچی گوڵووکە
زەرد و سوور وەکوو بووکە

دەخوێنن کۆتر و بولبول
دەفڕن لەم چڵ بۆ ئەو چڵ

دەنیشن لەسەر گوڵان
وەکو پۆلی پەپوولان

دەمژن ئاونگی غونچە
لەم گوڵزارە و لەو باغچە

لە کێوان قاسپەی کەو دێ
دڵ شاد دەبێ دەست بەجێ

لە ناو ئەو ڕەزو باغە
ئەوی نە ساغ بێ ساغە

خە ملێون گردو چیا
بووینە بە هەشتی دنیا !

لێرە ژیان چەن خۆشە
دڵ هەمیشە لە جۆشە

ئەم دیمەنەی بەهەشتە
جێگەی سەیران وگەشتە

جێی ژوانی دڵدارانە
جێگەی چاوخومارانە

لەلایی هەڵپەڕکێیە
خۆشترین کات وجێیە

لەولاش مێرگ ومێرغوزار
جێی لەوەڕگای برخ وکار

شوان لەلایان وەستاوە
بەیانی تا ڕۆژئاوا

شمشاڵیان بۆلێ دەدا
لەوجێگەیە خۆشەدا

ئێوارە دەچێتەوە ماڵ
مەڕ دەباتە بەرڕە شماڵ

جا کاتی مەڕ دۆشینە
هەر مەپرسە و مەبینە!

چ دیمەنێکی جوانە
کوڕی چاو خومارانە

جێگەی عاشقی دڵدارە
کوشتەی چاوی خومارە

کوشتەی زوڵفی چین چینە
فیدای دەکا ئەم ژینە

لەعلی لێوی یاقووتە
قووتە بۆدڵ یاقووتە؟

گەردنی وەك بلوورە
کوڵمی وەك گوڵ سوورە

ئەم خاك و باخ و دەشتە
خۆشە هەر وەك بەهەشتە

سەرچاوەی ژینی کوردە
جێگەی دلێرومەردە

هەموو جێگەیەك خۆشە
دڵدار بێ مەی سەرخۆشە

# ١١ ی ئادار ...

بەبۆنەی جاڕدانی حوکمی زاتیمان بەناوکوردان
بووە ئاهەنگ وبەزم وکەیف لەگشتی خاکی کوردستان

چەن هەزاران ساڵە نەورۆز بووە جەژنی قەومی کورد
یازدەمینی رۆژی ئادار خۆشترە لەوبێ گومان

نیشتمان ڕازاوە ئێستاکە بەبەرگی زەردوسوور
رەنگی زەرد ئاڵایەسووریش خوێنی سووری رۆڵەکان

خاکی پاکی کوردەکان یەعنی خەریتە گشتی کورد
هەرلە دەرسیم ومەهاباد تاچیای حەمرینان

ئەم هەموو خاکە بەجاری خاکی کوردستانە وا
خاکەکەی زێڕە سەراسەرگشتی خاکی کورد زمان

ئەو دلێرانەی شەهید بوون هەر لە پێناوی وەتەن
وا لە بۆ مردن نەژین و مردن و هەر بۆ ژیـــان

چۆن وەکو یەعقووب نەگریێم هەر لە شەو تاکو بەیان
ئەو لە حەسرەت یوسف و من بۆ شەهیدی لاوەکان

چەند بکۆشین و بکوژرێین هەر کەمە بۆ خاکی پاك
چونکە وەك ئەقوامی عالەم هەیتی کورد مافی ژیان

زۆر خەبات کەر وا خەباتیان کرد لە سەر خاکی زەمین
پوچ بۆ یەکێکیان نضال و بۆ ئەویتر قەتلی گیـان ؟

میللەتی کوردو عەرەب هەردو لە سەرخاکی عیراق
دەست لە ناو دەستدا دەژین و زۆر بەخۆشی وەك بران

خاوەنی زانست و زانا بوو بە دائم قەومی کورد
خاوەنی ئەخلاق بەرزو مەندو ئازان بێ گومان

هیچ نی یە ئازای وەکوو کورد وا لە سەر ڕوویی زەمین
قارەمان وجان فیداو رۆڵەیی چۆل وچیان

چوست وچالاك و دلێرو مەردو ئازاوو نەبەز
شێرن ئەوانن نابەزن نیتیان ئەبەد ترسیان لەگیان

وا بە سەر چۆل وچیاوو دەشتی کوردستانمان
چەندەم ئازاو مەردی مەیدان ودلێرن رۆڵەمان

کردەوەت چەند گەورەوو پیرۆزو بەرزە ئەی شەهید

چونکە ژینی خۆت فیداکرد بۆ ژیـانی نیشتمان

ئێسـتا ئەم تەرمە عەظیمەی جان فیدایانی وەتەن

چاوەنۆڕی هاتنیتیان ـــــ باوەشی پێغەمبەران

بە سوزی دڵ ، دڵی "نووری" مەرەبخێن بەسە ئێتر

فیدا بۆ خاکی کوردستان بچووك وپیرو جاحێڵان

# سەیرانێک ...

ڕۆژێکی خۆشی بەهار
چووین بۆگەشتی نێوگولزار

بەنیازی شایی وسەیران
ڕوومان کردە نێو باغان

باغی چی هەر بەهەشت بوو
داوێنی دۆڵ و دەشت بوو

لەجێیەکی یەکجارخۆش
دڵی دەینا جووڵەوجۆش

خۆم و خێزان بە شادی
دانیشتین بە ئازادی

بە هیوای سەیران کردن
ڕۆژی خۆش بەسەر بردن

خستمانە جۆش سەماوەر
قۆری عەجەمی لەسەر

پیاڵەو ژێر پیاڵەو مەلاك
قەندو شەکری سپی و پاك

دانراوە لە سەر تەبەق
چەند شیرینە هێندە ڕەق

سەماوەر بۆری لە سەر
دووکەڵی لێ دێتە دەر

کیژەی سەماوەر لەوێ
خۆشە دڵ خۆشی ئەوێ

بە گورجی زوو دێتە جۆش
دێم دەدرێ چایەی بۆن خۆش

قۆری سەرپۆشی لە سەر
خراوەتە سەر سەماوەر

دیمەنێکە زۆر جوانە
خاوەن زەوق بۆی حەیرانە

سەماوەر لە هەرجێ بێ
غەم باردەکا لە ئەوجێ

سەماوەر زەردو سپی
بیست وچوار سەعات هەبی

شیرن وتاڵ تێکەڵاوە
فڕکە تازەوقت ماوە !

ئەودولبەرە چاوکاڵە
بابێ تێکا پیاڵە !!

لە کوێ دانێین سەماوەر
باوەصفی کەین ئەوێندەر !

لە سەرکانی و کانیاوێ
لە ڕۆخ جۆگەلە ئاوێ

ماسی سەوزو سوورو زەرد
دێن و دەچن لە سەربەرد

بەردو چەوی ئەو ئاوە،
زەردو سوور تێکەڵاوە،

سەرنج بدە ببینە
ئەو ئاوە چەند خاوێنە

ئاوی بەفری تواوە
لە سەرشاخی ئەوناوە

بۆ ناو تاڤگە دێتە خوار
لەویش دەڕژێتە ڕووبار

تاڤگە دیمەنی جوانە
فرمێسکی دڵدارانە !

وا بە خوڕەم دێتە خوار
بۆ ناو جەنگەڵ و گوڵزار

لەولاش کە ناچە و بولبول
دەخوێنن بە جۆش و کوڵ ،

دیمەنی ڕەنگینی شاخ
جوانە گوڵزار و باخ

دنیا سەوزە بە جارێ
گوشادی لێ دە بارێ

سەیرانێك لە جێی وا بێ
کەس خەمی لە دڵ نابێ

تێر دەبێ لە گوشادی
مەست دەبێ بە ئازادی

کوردستان سەیرانگایە
خۆشترین جێگەی دنیایە

جێی نەوەی کاوەی گوردە
بەهەشتی پاکی کوردە

# لیۆ

# یاقووتی لەبی لەعلت

یاقووتی لەبی لەعلت قـــووتی دڵی دیۆانە
دیۆانەیە بۆ لەعلی ، لەعلی لەبـــــی جانانە

بۆلەعلی لەبی جانان ، جان و جەسەدی عاشق
حەیرانی لەبی لەعلت ، ئەو لەعلی بەدەخشانە

ئەو لەعلـــی بەدەخشانە هەم عەترە گوڵ ئەفشانە
یەعنی لەبی یاقووتت یاقـــووتی دڵە جانە !

یاقووتی دڵە جانە ئەم جانە کە چەند جوانە
مەرجانە لەبی لەعلی لەعلی لەبـــــی مەرجانە

هەم شەهری شەکەرخوانە هەم شەربەتی ڕومانە

بۆلەعلی شــەرابی لێو دڵــ مایلی مـەیخـانـە

ئەم ئاهووە ماچیـــنە زولفی هەمووچین چینە

ئەو زولفە کە چین چیـــنە پێوسیتی نی یە شانە

(نووری) بە تەمای قووتە لەلێوە کە یاقـــووتە

یاقووتـە وەیا قـــووتە ئەو لەعلی درەخشانە

# گوڵ منم

گوڵ منم دەیلێ بەمن یار بۆچ تەماشای گوڵ دەکەی ؟
حەیفە ئەم بوختانی ناحەق ئەی گوڵی من پێم دەکەی ؟!

حوسنی گوڵ یەك ڕۆژە دولبەر حوسنی تۆ هەر دائیمە
تۆ ڕەفیقی دڵی جانا گوڵ ڕەفیقی خارەکەی

جا چلۆن ئەکرێ قیاسی دڕك و گوڵ وا پێکەوە
فەرقی هەند زۆرە مەسافەی ئەرز لەگەڵ ئاسمانەکەی

خۆ دەزانی ئێمە هەروەك بریندارین لە دڵ
هەر لەمە مەعلوومە عاشیق چەندگرانە زامەکەی

من نەزانم بۆتۆ چۆنم تۆش دەزانم وای بۆمن
دڵ وەکوو ئاوێنەیە وا تۆتەماشای گەر بکەی

ئەو دڵەی هەیتم دەزانی خۆ دڵت تۆیە لەلام
رووحەکەم هەرتۆی لەناوی زەخمی دڵ تیمار دەکەی

ئەو دڵەی تۆش خۆ دڵی خۆمە لەلاتە چاوەکەم
با بسووتێم من لەناوی هەر بەئاگری عیشقەکەی

گوڵ تەماعی لەعلی لێوی کوڵمی ئاڵی کردووی
زۆر بەچاکی من دەزانم ئەو دزیویە ڕەنگەکەی

تێکەڵاوە جیسم و جانمان مەڵێ لای تۆ، تۆلەلام
چونکە پەیدا بوین لە نەسلی ئادەم وحەووایەکەی

جا چ باکم هەیە لە دووریی ڕۆح لەگەڵ ڕوح تێکەڵە
ڕوحەکەی یار ڕوحمە ڕوحی منیشە ڕوحەکەی

ئەی لەکوێی مابێتە دەگوتم تۆتەماشای گوڵ دەکەی
(نووری) حەیف بوو بڵێ بولبلتانی ناحەقە چۆن دەکەی

○

# بەستەی چاو خوماری

چاوی چاوم چاو خوماری
بە لە نجەولاری گواری
حاڵی من پرسە تۆ جاری
دڵ نەیما سەبرو قەراری

پیشەکەم گریان و زارە
هەروەکوو نالەی هوزارە
روح بێ تۆ لە خۆی بێزارە
چەند بە غەم، چەند بە ئازارە

لەعلی لێوت وەك یاقووتە
یاقووتە بۆ دڵ ئەمقووتە!
دڵ دایم مایلی ڕووتە!
تا مردن چاوم لە دووتە!

سەبەبکار لەگەڵ ئەغیارە
خوایە لێ دڕێن لە سێدارە
لێی دوورخستمەوە ئەو یارە
کافریش ناکا ئەم کارە!

سینە کەت باخ و بێستانە
جووتێك بەهی لە ناویانە
طفلی دڵ چەند بێ ئەمانە!
واگری گرتووە لەوانە!

گردنت سوراحی ئاوە
بۆنت خۆشە وەك گوڵاوە
بەندت كرد دڵم بەم داوە
بە زوڵف و پەرچەمی خاوە

بە ئەبرۆ و چاوی جوانت
بە زوڵفی سەر نێوچەوانت
دایپۆشی نیوەی گوڵمانت
حەیرانی پەرچەمی شانت!

دڵ وەكوو منداڵی ساوا
گری لەم مەمكانە داوە
چونكە وا قووتی تێ داوە
قوتێكە بۆ هەردوولاوە!

من بێ تۆچی بکەم لێرە
دڵ دەڵێ کوا ئەم دلێرە ؟
رەحمکە فەرموو تا ئێرە
چاوی ڕوون لە دووریت کوێرە !

ئەگریجە و زولفی چین چینە
چاوو ئەبرۆت دڵ ڕفێنە
رەحم کە رووت بۆلام بێنە
هەتاکەی ئەم ڕق وکینە؟

لە عیشقت دڵ کەوتە کێوان
لە دووریت روح هاتە لێوان
جارێ گەرلێم ببیە میوان
سەرئەکەم فیدای دووچاوان

ئاگری عیشقم بە جۆشە
گڕەکەی وەك ئاگرو پووشە
یار دڵی ناسکە وەك شووشە
هەرزیزەو بەبێ ناخۆشە

شێواوم چی بکەم لە دەستی
دڵی نافام گڕی بەستی
بۆ سنگ و مەمك و ئەنگوستی
بە عیشق هیچ کەس ناوەستی

ئاخیەتی (نووری) لە دووری
بۆ ئەو یارەی مەیلی گۆڕی
بە لەنجەو نازی کە (نۆڕی)
دڵ تەیرێك بوو کەوتە تۆڕی

□

# ژن

ژن غونچە گوڵی باغە
دڵ وا لە بۆیان داغە

کوڵمە گوڵ و لێو لەعلە
شیرین و بەدەم نوقڵە

ئەو زینەتی نێو ماڵە ،
ژینم بەبێ ژن تاڵە !

ڕوحێکی ڕەوانە ژن
هەم فێنکی دڵانە ژن

شیرین و جوانە ژن،
وەك حۆری بجینانە ژن

روحم ژن و عومرم ژن
دوور بم لە تۆ دەمرم ژن

ڕوومەت خڕی چاوکاڵە
کوڵمە گوڵی وەك لالە!

ئەو لالە عوزارانە
ئەو خونچە بەهارانە

ئەوجینە لە ئێمانە
فێنکایی دڵ و گیانە!

ویـرانه بـه‌بێ ژن مـاڵ
ژین ژانــه بـه‌بێ چاوکاڵ

دوستێـکی حه‌یاته ژن
ڕێـگای نه‌جـاته ژن

ژیـن ژانه به‌بێ ژن ژین
ژیـن ژینه له‌گه‌ڵ ژن ژین

چونکـه له‌زه‌تی دونیـا
ماڵ و ژنــه وا تـه‌نیا

هــه‌رچه‌ند بنووسی (نووری)
له‌م وه‌صفــه گه‌لێ دووری

ن

# گوڵ لەگەڵ گوڵدا ...

ماوەیێکی زۆر گوڵ لە دەست گوڵ بوو
ئێستا ئەوگوڵە نوستووی ژێرگڵ بوو

حەیفە ئەوگوڵەی بەبێ مەی مەستی
ببێتە خۆراك بۆگوڵی دەستی !

تەعەجوب مەکەن دەردی گوڵ لە خاك
ئەوگوڵ ئەندامە بۆگوڵ بۆتە داك

داروو درەخت وجێگاوومەکان
وائاو دراوە هەر بە خوێنی وان

بۆیە ئێستاکە گوڵ وگوڵزاران
لێیان دیارە وێنەی عوزاران

چونکە ئەوانەن لەژێر ئەمخاکە
زینەتیان بە گوڵ داوە بەچاکە

شیرن گوفتاری هەر ئەوجوانان
کۆ دەکرێ دەنگیان رۆژێك لە ئاسمان

مومکینە باوەڕ نەکەن بە مانە
بێ گومان دەردێ وائەمقسانە

ئەم ئیکتیشافە درەنگ بێ یا زوو
عەقڵ دەیکا تن نەك قووەی بازوو

روح لە گەڵ روحدا لە فەزای ئاسمان
لە حەقیقەتدا دەبنە شادومان

مادام وەهایە ئەوگولە ندامان
تێکەڵ دەنگیان وا لە گەڵ دەنگمان

چاووبرژانگ و ڕوومەت ولێوان
لە دەشت وچۆڵ وصەحراو کێوان

گەر لە سەرخاك وگەر لە ژێرخاکا
عاشق و مەعشووق وا بوون بەیەکا

ئەختی وورد بەوە لە شێوەکەمدا
لە ئامانج دەگەی لە حەقیقەتدا

چونکە ئەشعاری حافزو سەعدی
لەگەڵ خەیامدا هەروا بووقەصدی

ئەم گوفتارانەی گوتم: بێ گومان
ڕۆژێك دێ (نووری) ئەبێ وەك ئەوان

## زوڵف

چین چینە زوڵف چینی لەسەر چەهرەو چاوە
داخە لەبۆ ئەم زوڵفە کە ڕۆژیەو بوە ئاوا

بایداوە دووژ زوڵفەیێ لە سەرگەردنی ئاڵا
حوسنی یوسفە جانە بە ئەم رووخە دراوە

خونچەی گوڵە دێ بۆنی دوو زوڵفەیێ ئەوسیتا
وا پەرت بووە ئەم بۆنە لە هەر لاوە بڵاوە

ئاهووی خوتەن بۆنی لە زوڵفەیێ دزیوە
عەتر و عەنبەر و مسکە لە گەڵ بۆنی گوڵاوە

داو داوی دوو زوڵفەیێ کە هەر داوێکی داوە
بەو دانەو داوە دڵە کەم کەوتوتە داوە

ئەو داوە یە هەرداوی پەرێشانە لە سەر ڕوو
بۆ داوی پەرێشانی دڵم حاڵی نەماوە

نیم نیمە زوڵف، خۆ بە خەنەو خاوێن و خاوە
چین چینە هەموو پەرچەم و ئەو زوڵفی چەماوە

ماچینە لە چین چەهرە گوڵەی سەهمی لە چاوە
بەو سەهمەیە (نووری) جگەری پارە کراوە

---

# پێنج خشتەکی جاهید
# لە سەر غەزەلی (نووری)

عاشق کە سەری نا لە ڕەهەت شەرت و وەفا چی
دەردی لە هەزاران چووە دەر ، دەردو جەفا چی
ئێستۆکە دڵم هاتەوە لام شەرم و حەیا چی
ئێو پەرچەمە لادە لە سەر ئەو ڕوومەتە لاچی
ماڵ و سەر و ڕوحم کەمە بۆ قیمەتی ماچی

ئەی دوڵبەری ڕەعنا بەسە ئەم غەدرو خەیاڵە

زوڵفت کە قوماندانە بەسەر بەرچەم و خاڵە . .

ئەم عیشقە لە ئەم کەللەیە تێکچوونی مەحاڵە

شەمعی ڕوخی تۆ شوعلەیی داوە وەکوو لالە

سووتاوە دڵم خوایە بە سووتانی چراچی

□

خنکاوە لە ناو بەحری غەما دڵ بە تەبیعەت

شادی سەفەری کردووە لای مە بە حەقیقەت

ئەم ماوە نەفەس لێنێرە بەسەرما مەکە مینەت

ئەو لەشەنرم بەسە جەورو جەفا ئەزیەت و میحنەت

ڕەحمێ بکە بە سێتی فیغانم بەسەماچی

نەورۆزە بەهار عالەمی لە حیا لەکنارێ
بێ حەددو حیساب لالە و نێرگز بێ ژمارێ
گەرچی گوڵی بۆن خۆش لە هەموو لاوە دیارێ
عاشق بە مەیی عیشقی تۆ سەرخۆش و خومارێ
هەرچی سەری بێ عیشقە حەیاتی بە هەباچی

□

پەیمانە وەهابێ لە عیشقبازی نەکەم کەم
تەبریکی دڵ ئاوارەمە گوێ نادەمە عالەم
باکم نییە بڕژێ دڵ و گیانم بە جەفا و غەم
بۆ یارە فیغان و ئەلەم و حەسرەت و نالەم
سەرخۆشی جەمالی تۆوە دڵ با بە جەفاچی

□

تووتی دڵی بێچارەیە ئازاری حەبیبان
لوتفی گوڵە پەعنایە دەوای دەردی لەبیبان
ئەو نەقش و نیگارە کە بە تۆی داوەتە یەزدان
چاو و روخ و ئەبرۆتە لەگەڵ چاهی زەنەخدان
ئەم صوورەت و نەقشە لە دڵم زەحمەتە لاچی

جا هیند کە بەرەنڵایە لە سەحرای بیابان

بەس مەیلی ویصالی تووە ناڵانی لە هیجران

ئیمڕۆ کە رەمەت کرد کە دەپرسی لە غەریبیان

بیمێ خۆشە سەروو ماڵ و بەدەن بیکەمە قوربان

بۆ ژێر قەدەمت حازرە (نووری) بە فیداچی

# پێنج خشتەکی «نووری»
# لەسەر غەزەلی «بێبەش»

دڵم مەفتوونی شۆخێکە بە دایم دڵ گرفتاری ،

فیدای کوڵەکەی ئاڵ و بە عیشوە و لەنجە و لاری ،

خودایە حەفظی کەی بۆ من لە دەست بەدخوو لەچاو زاری

دڵم لەرزی لە ناکاوا کە دەرکەوت ماهی دیداری

خومارو مەستی کردم وەک دووچاوی مەست و خوماری

ژیان چەند خۆشە خۆگەر بێ بنیشێ یارم لە ئەم ڕۆژە
بە نۆبەت بگرم و ماچ کەم لە سینەی ئەو جووتێ خۆخە
لە دەوری ئەو بەهەشت بۆمە جێگای ئاخ و داخم تۆخە
فیدای ڕوح و ماڵ و دڵ چی فەتتانێکە ئەم شۆخە
تەلیسمی دڵی چۆن بەستووە بە داوی زوڵفی سەحاری

□

لە ناو موڵکی جیهان ئێمڕۆ نییە وەک چاوی شەهلاکەم
لە ناو بەحری مەلاحەتدا میثالی دوڕڕە عەزراکەم
هەزار غەوواسی وەک مەهەر فیدای گەردانی میناکەم
لە بەحری وەحدەتی خۆداکە مە نی یە هەمتایی لەیلاکەم
لە بۆیە دڵ وەکوو مەجنوون دەکا دایم فیداکاری

□

دەبینم چاوەکەی کاڵی لە ژێر دوو قەوسەکەی ئەبرۆی
بە سورمەی قودرەتی باری چەلۆن نەقشاوە ئێستا بۆی
ڕوو پۆشی ڕوومەتی لادا سووتایەک جارە وا دڵ بۆی
دەبینم کەزەکەی زوڵفی لە نێو فیردەوسی ڕۆژی ڕووی
بە شەرعی ئێمە نەم بیستووە بەهەشت بدێتە کوففاری

ئیلاهی صووره‌ی دولبه‌ر چلۆن نه‌قشاوه به‌م نه‌قشه
به ئه‌مری زاتی یه‌زدانی یه‌دی بێزایه ئه‌م نه‌قشه
چی حه‌ددێکی هه‌یه نه‌ققاش که بگری وێنه‌ی ئه‌و نه‌قشه
له نه‌قشی صووره‌تی مانی ته‌حه‌ییور ماوه له‌م نه‌قشه
کراوه نه‌قشی ماهی ڕووی به ده‌ستی قوده‌تی باری

به له‌ب له‌علی به ده‌م نوقڵی به مووسونبول به قه‌د عه‌رعه‌ر
به ڕوو ماهی به دڵ شاهی به قیمه‌ت هه‌ر وه‌کوو گه‌وهه‌ر
به چاو بازی به ناز نازی به له‌نجه‌و عیشوه‌وا یه‌کسه‌ر
به قه‌د عه‌رعه‌ر به ده‌م شه‌ککه‌ر به ڕوو ماهی به چاو ئه‌ختەر
که مه‌رموو ناسك و دولبه‌ر به عه‌ینه‌ن ڕۆژه ڕوخساری

بلا (نووری) نه‌بێ بێبه‌ش ئه‌گه‌ر یاری بکا مروه‌ت
له بۆ ئه‌و چاتره ئێستا له ڕوتبه‌و مه‌رته‌به‌ی ده‌وڵه‌ت
به نۆبه‌ت پێی بدا ماچی له‌بی له‌علی وه‌ی و کوڵه‌ت
چ خۆشه ئه‌و ده‌مه‌ی بێبه‌ش بفه‌رمێ ساوه‌ره خه‌لوه‌ت
که‌ره‌م که پێم ببه‌خشێ ماچی کوڵه‌و نوقته‌ی زاری !

# پێنج خشتەکی بورهان جاهید
## لەسەر غەزەلی «نووری»

مەحروومی ویصالی تووە موشتاقی جەمالت
موشتاقی فیداکاری یە مەقصەد لە ویصالت
حوسنت منی شێت کردووە نەک جاهو جەلالت
شێواوە دڵم هێندە لە بەر فیکرو خەیالت
بۆ حاڵەتی من شاهیدە ئەو چاوی غەزالت

ئەم ڕوومەتە وەک بەدرە هەموو دەم لە سەمادا
دڵ مشتەری یە کەوتووە دایم لە جەفادا
حەسرەت کەشی هیجرم نی یە باکم بە سەفادا
توڕڕەی سەری کولمت وەکو ماهە لە ضیادا
وا حەپسە لە نێو زولفی سیاهت ڕوخی ئاڵت

یەك زەڕڕە لە عیشقت دڵەکەم قەت نەبوو خالی
جاری بە وەفا نەمری بپرسی چی یە حالی
عاشق چی یە لەم عیشقە مەگەر مەیل و مەئالی
دڵ وا لە فیراقی گوڵە دایم کە دەناڵی
وەك بولبولی بێچارە لە هیجرانی وصالت

پێم خۆشە ئەگەر نەبڕی لە من عیشوەوو نازت
تەقسیرمەکە کوشتن بێ ئەگەر مەیل و نیازت
قوربان و فیداکارە لە عیشقی تۆ مەجازت
سەردارە لە پێش لەشکری دوو زوڵفی درازت
شەرپانە لەگەڵ پەرچەم و ئەبرۆی هیلالت

زائل کە لەبۆ یاری وەفات ئەم رق و کینەت
تێنوومە لە من مەبڕەوە ئەم مالێ مەعینەت
ئەم عیشقە لە دڵمانە نە موحتاجە بە زینەت
قووتی دڵمە ماچی سەر ئەو ماهی جەبینەت
گەر بێتو کەرەم بێ لە دوو کوڵمەینی هیلالت

دڵ گەرچی دەسووتێ هەمووکاتێ لە فیغاندا
مەربووت نی یە ئەوزاعی حەیاتێ بە زەماندا
هەرچی لە دەسم دابوو بەدڵ پاکی بەواندا
مومتازە کە ئەم سێ یە لە ناو موڵکی جیهاندا
بەژنت عەلەم و غونچە دەم و نووری جەماڵت

سەرکەوتە تەحەیور لە موناجاتی عەجەبدا
چەشنت نی یە وەڵلاهی لە ئەوصاف و نەسەبدا
دڵ گەرچی دەترسی لە مولاقاتی غەزەبدا
سەد حۆری بەهەشت ناگەنە نەعلت لە ئەدەبدا
قوربانی حەیاو عەهدو وەفاو عەقڵ و کەماڵت

قەد عەرعەرو لیو شەکەرو ئاشووبی زەمانی
بەم حاڵە تە مەشهووری پەریزادی جیهانی
سولتان و فەرەح بەخشی دڵی ڕاحەتی گیانی
هەرچەندە بکەم وەصفی تۆ جانا لە جوانی
ئەم دیوە لە ناو ئەوعی بەشەر نابی میسالی

هەرچەندە گوڵی گیانە منم بولبولی زارت
تەردم مەکە کەوتوومە لە ئەتراف وکنارت
(جاهید) لەبەر ئەم حاڵەیە نەتماوە قەرارت
(نووری) بە ئەدەب بیکە تەوافی روخی یارت
تەقبیلی کە فەرزە حەجەرولئەسوەدی خاڵت

## پێنج خشتەکی جاهید لەسەر غەزەلی "نووری"

دەڵێن ئەیامی گوڵزارو بەهارە
بە غەیری سەیری گوڵ نیتم چ چارە
کەرەم فەرموو بچین بۆشەوکنارە
هەڵستاوی لە خەوچاوت خومارە
دڵت کردم بە غەمزەت پارە پارە

بە خوێنی دڵمە سوورە هەردوو کوڵمت
بە ئەبرۆت لەت لەتی کرد جەرگ و دڵت
ئەگەرچی زۆرە بۆ ئەم گیانە زوڵمت
بە حەنەی پەنجەکانت لادە زولفت
بە دەرخە ماهتابی دەووچارە!

گرفتارم بە کاف و ئەلف و میمێ
نەسیبم وایە نەم دی هیچ هەرێمێ
لە سەر شەوقی دڵت وەستاوە غیمێ
کەرەم فەرموو بە میم و ئەلف و جیمێ
ئەوەی دەیزەی زەکاتی ماچی پارە!

لە حەسرەت مام دەمێ دڵمان نەبوو جووت
ئەبێ وابێ نیزامی عیشقی جادووت
ئەگەرچی مارە بۆ دڵ هەردوو گیسووت
لەبی لەعلت هەمە یاقووتە یاقووت
کە قووتە بۆ دڵی من وا دیارە

بەمن چی عودو تارو نای و سازت
وەری گێڕام لە دین دوو چاوی بازت
ئەگەر هەتبێ کەمێ شەوق و نیازت
بەخەندەی شیرن و لەنجەی بەنازت
گوزەر فەرموو بە سەر ئێمە دووبارە

بە عیشقت سەر لە سەودا مل لە ناو کۆت
مرووەت چاکە بەم حاڵە نەمام بۆت
ئەمان کەگیانە لە هیجرانا دڵم سۆت
دەبینی خادیمی بیچارەکەی خۆت
لە دەوری تۆ بەبێ سەبرو قەرارە

نەما ڕۆژانی شادی و کەیف و سەیران
وەفا دەوری نەما لای دۆست و یاران
دەبا جاهید ببێتە وێڵی کێوان
بکە ڕەحمێ بە حاڵی (نووری) قوربان
فەقیری دەرگەتە چاری نەچارە!

## لەگەڵ بەشی کۆمەڵایەتی دا :

# لە نێوان نووری و بێ بەش دا

(بۆ مامۆستا بێ بەش)

لە موڵکی گیتی دا نیتی ئەبەد بەش
لە بەر وەی ناوەکەی خۆی ناوە بێ بەش
لە مەیدانی هونەرمەندی و ئەدیبان
مەلا مەسعوودی (بێ بەش) نابێ بێ بەش

○ وەڵامی بێ بەش ○

شێخی شاعیر خۆشەویست و (نووری) چاوی (بێ بەش)ی
شاعیری زۆر خۆش قەریا ـ سەد شوکر خاوەن بەشی
تۆی طەریقەت نەقشبەندی شێخ جەلالی شێخ جەمیل
مەردو مەردانەو نەبەردو دڵ بە بێ گەردو غەشی

١٩٨٤/٥/١١

لەگەڵ بەشی ئایینی دا :

## پێنج خشتەکی جەمالی سەید ئەحمەدی کوبی
## لەسەر ستایشی پێغەمبەر لەلایەن نووری یەوە

لە پیشەو کارو نەفسم نارەزامە (یارسُولَ اللّه)
لە دەستی ئەو شەپرزەو موبتەلامە (یارسُولَ اللّه)
لە رێگەی چەوت و کاری نارەوامە (یارسُولَ اللّه)
حەریصی ئیشی نافەرمای خودامە (یارسُولَ اللّه)
ئەسیری پەنجەیی نەفس و هەوامە (یارسُولَ اللّه)

لە دنیای پیسی بۆگەندا منی نادان لە غەفلەتدا
لە تاریکی جەهالەتدا منی بێ بەش لە تاعەتدا
چلۆن دەرچم لە رۆژی حەشرو میزان و قیامەتدا
لە دەستی نەفسی (أمّارة) لە زنجیری ئەسارەتدا
سەراپا غەرقی عوصیان و خەتامە (یارسُولَ اللّه)

بە ڕوو زەردی بە ژاکاوی سەراسیمەو برینداڕم
لە گێژاوی خەتاباریش غەرق بووم وخەتا بارم
بە ئیمدادم وەرە جانا گەلێ لەم حاڵە بێزارم
شەفاعەت کە دەخیلت بم گەلێ عاصی وگوناهبارم
بە دایم ڕوو ڕەشی ڕۆژی دەوامە(یارسُولَ اللە)

لە ترس و لە رزی ڕووی مەحشەرسەرم شێواوە بخومن
غەریب وشەرمەزارو بێ کەس وبێ جێ و مەئوا من
لە بەر بێ مایە ئێستاکە هیلاك و سووك و ڕیسوا من
خەجالەت بارو شەرمەندەو حەقیرو کەوتووم وامن
لە دەرگەت بەندە ناچیزو گەدامە(یارسُولَ اللە)

فیدات بم هەرمنم ئێستا هەژارو ڕووت وسەرگردان
لە شارو دێ ، لە دەشت و دەرلە ئەشکوت و لە سەرگردان
نی یە چارەم بکا هیچ کەس وەرەس بووم والە بەردەردان
بە چاوی مەرحەمەت جارێ بنۆڕە حاڵی من قوربان
لەگوشەی بابی لوتفی تۆ خزامە(یارسِوُل اللە)

ئەتۆ(طه) و(یس) نی ڕەئیسی ڕەهبەرانیش تۆی
ئەتۆ ڕوح و دڵ و جانی تەبیبی حاڵ زانیش تۆی
ئەتۆ زۆر گەورە خولقاوی حەبیبی کائیناتیش تۆی
ئەتۆ دەرمانی دەردان و پزیشکی میهرەبانیش تۆی
ئەخۆشم بە ئەم موحتاجی دەوامە(یارسولَ الله)

بەمژدەی ئایەتی (لاتقنطوا) شادی گەلێ بەخوا
ئەگەر تۆبەی بکا ئیسلام گوناهی پێ دەچێ و دەڕوا
(جەمال)کەوتوتە سەر ئەژنۆ بە هانای زووبگە توخوا
لە دوو عالەم ئومێدی (نووری)یی بێ کەس بەتۆیەوا
بەمە ئاسودەیی ڕۆژی جەزامە(یارسولَ الله)

## شیعری کۆمەڵایەتی :

# مێژووی لە دایک بوونم

هەزار و سێ سەد و بیست و شەشی ڕۆمی چ تەئریخە
ئەوا مێژووی لە دایک بوونمە بە ڕاستی تۆ دەری بێنە

دەڵێن لەو ساڵەدا زستانی بەفرێکی گەلێ باری
بڕی کرد دەشت و چۆڵ و بان گەیشتە تا لقی داری

بە مافووری سپی یەزدان زەوی بەرگی سپی پۆشی
گەلێ حەیوانی بێچارە لە بۆ خواردن نەما پووشی

دڕندە و ئاسک و پۆڕ و کەو و کەروێشک و کۆتر وا
لە بۆ دۆزینەوەی قووتیان هجوومیان کردە ناو شاری

بە ئەبجەد دەرچووە تەئریخی بائەجفیە کە (قاریاغزی)
بە کوردی یەعنی لەم مێژووە کەوا ئەو بەفرە وا باری

## باسی شەڕی دووەمی جیهان[1]

عالەم لە سەر ئەم ئەرزە کە گشتی شڵەژاوە
بەم ئافەتی حەربی دووەمە بەندی پساوە

هەر جێگەو ئەرزێکی ببینی لە جیهاندا
دای گرتووە شەڕوا لە هەموو خاکی بڵاوە

تێک تێک دەقرێن عەینی دەڵێی حەشرە بەجاری
دەببابە لە سەر ئەرزو فڕۆکەش لە هەواوە

بەرپاکەری ئەم ئاگرە وا (هیتلەرە) ئەمڕۆ
بەم ئاگرە عالەم جگەرو قەلبی سوتاوە

ئەو نووزەو ئاهی هەموو خەڵق ناڕوا بەخۆڕا
زاهیر دەبێ ئەم حەقە لە پێش عەرشی خوداوە

هیجرانی وەتەن دەربەدەری و تەرکی وولاتە
ئەو ظولم و گوناهە لە مل ئەو ظالمە ماوە

ئەو لەشکری وەك کومەڵی مەرکونە بەجاری
بەسراوە حەیاتیان بە قومانندەو ئومەراوە

هەر بەرز و بلند بێ عەلەمی خاکی عیراقمان
سەربەرزی و شانازی کە بەم میللەتە دراوە

١٩٤٣

---

(١) لەسەر شێوەی مەلای مەروون .

# ژن

گەر یەك ژن هەبێ لە ماڵ بنەوان
زۆر چاك دەسووڕێ كاروئیشی وان

بەعەكسی ئەمە ژن نەبێ لە ماڵ
كاولە ئەو ماڵە بێ شەك وگومان

# هەجو

ئەو چیزە كەوا (......) زۆر زۆر بێ صیفاتە
شەخسێكی بەد ئەخلاق و دەنی و پوشتی وولاتە

ناچیزە بە ناچیزەیە هەم چیزی زەمانە
پەروەردەی بەدگۆییە مەشهووری جیهانە

ئەخلاقی دەنی مەشرەب و ئەطواری ژنانە
هەر شەخسێ رەفیقاتی بکا مەقصەدی (...)

---

ناموس و حەمیییە و شەرەفی پوولە بە تەحقیق
گەر نات لە مستی دێتە دووت بۆ بنی خانە !!

# وەسیەت بۆ منداڵەکانم

جەماڵ و کەماڵ ، شێرزاد و شێروان
دارا و دیار و کاکەمەم ساوان

سوێدین و نەرمین لەگەڵ دلارام
دەتان سپێرم بە زاتی یەزدان

بژین بە بەرزی و بە کامەرانی
بە شادی دڵ و بە کەیف و سەیران

هەندێکتان گەورەن هەندێ ترساوان
گەورەکان بکەن باوکەتی گچکان

بچکەش حورمەتی گەورەکان بگرێ
پەندەکەم بگرن هەردەم لەگوێتان

دنیا وەك ژوورێك دوو دەرگەی هەبێ
لە ناوی دەژین بۆیەك پاروەنان-

لەیەك دەرگەیدا تۆدێیە ژووری
لەوی تر دەردێی بێ روح وبێ گیان

مادام وەهابێ دنیا هیچ نیە
شەڕو شۆڕ مەکەن لەگەڵ یەکتریان

تەماعی دنیا لاشەی مردارە
ئەوی سەگ نەبێ لێ نادا ددان

قەت نەکەن غەدر بکەن لەخۆشکان
هەرچیم بەجێ هێشت تێی دایە بەشیان

چونکە هەموو کەس چ ژن چ پیاو
دەیەوێ زۆر چاك بژی بێ گومان

هەندێکتان بژین بە خۆشی و شادی
خوا نەکا لای تر موحتاجی دوونان

من لە ناو گۆڕا نالحە سینمەو
گەر ئەو حاڵە وا ڕوودا لە ناوتان

لە سەر ئەم کەونە فەقیرو زەنگین
هەر کەس هەیەتی واحەقی ژیان

یەکی زەنگین کرد زرووف و زەمان
ئەوی تر دەژیت هەر بە ڕەنجی شان

جگە لەمانە تو خوا ڕۆڵەکان
ئاگاتان لێ بێ لە دایك و پلکان

گەر من نەمردم هەتا زەمانێك
هەقی باوكی یەتی هەردەكەم بۆتان!

تەرخانە گشتی ئەو موڵكی هەیتم
لە ڕێگای خوێندن صەرف ئەكەم لێتان

قەت نەكەن غەدریش بكەن لە هیچ كەس
قەبووڵیش مەكەن گەر كرا لێتان

والە هەردوو لا صوڵح و سەلامەت
ڕێبازی چاكە بمێنێ لاتان!

گەورە لە گچكە نەكا ستەوكا
گەر بە قسەم نەكەن زەحمەتە ژینتان

گەر لە گەڵ یەكتر شەڕو شۆڕ بكەن
لە لای هیچ كەسی نابێ حورمەتان

ئێوە ڕۆڵەکان ڕوحی شیرینم
لە دەستتان نەدەن قەدروقیمەتتان

لایەنی ئایین قەت نەکەن بەردن
چونکە ئەمڕێکە ئەمری خوداتان

هەتا دەتوانن هەرچاکە بکەن
درەنگ بێ یا زوو هەردێتە ڕێتان

ڕاست بن ڕۆڵەکان قەت نەکەن درۆ
گوتراوە «ڕاست بە بڕۆ ڕێی شێران»

دڵ وەکو شووشە بشکێ چانابێ
دڵان نەشکێنن ئێوەو خوداتان

دۆست بین لەگەڵ ئینسانی خراپ
ئەزیەت دەکێشن ئاخر پەشیمان!

«ئەگەر گوڵ نەبن درکیش مەبن»
پەندێکی خۆشە پڕ مەعناو جوان

گەر زانا نەبوون لە سیاسەت مەدوێن
لە سەر ئەو ڕێیە هەزاران فەوتان

کاری سیاسەت بە هەرکەس ناکرێ
خاوەنی خۆی بێ ئەوان ئیشیتیان!

ئەوی هەڵستا لە سیاسەت دوا
بۆیە قوڕ کرا هەروا بە سەرمان

وا خزمەت زۆرە گەر پێتان کرا،
فەقیر بە خێو کەن هەژاری شارتان

ئامانجم لێرە بە هەرجۆر خزمەت
بکەن خزمەتی کورد و کوردستان

ئەو کەسی کورد بێ زۆر بە پەرۆشی
دەبەخشێ گیانی لە ڕێی نیشتمان

ئەوی هۆشی بێ نازی بۆ مردن
لە ڕێی وەتەندا دەمرێ بۆ ژیان

گەر شتێک ڕووی دا نەکەن غەم بخۆن
چونکە بە خەمیش پێک نایێ ئێشتان

ئەو شتی چووبێ جاری تر نابێ
گوتراوە «مەچوون قەت لە دوو چوان»

غەمخواردن هیچی لە جێ شین نابێ
قسەی نەستەقە بگرن لە گوێتان!

گوریس لە بنی دنیا ڕامەخەن
تەنیا هەوڵ دەن بۆ نان و قووتتان

سامان و پارە بێ تەندروستی
نابێ بە سوودی یەك رۆژ صحەتتان

مەکەن قومارو مسکرات مەخۆن
چونکە خیلافی شەرعەو ئایینتان

وا شیرین مەبن کەوا قووت بدرێن
نەوا تاڵیش بن بکەن نەفرەتتان

ئەگەر زەنگین بوون بە چاکی بژین
حەقی بە دەنتان هەیە لە سەرتان

ئینسان چەند بژی هەر دەمرێ بێ شك
کە بۆ خۆی رۆیی لە کوێ ما سامان

نەکەن سەر زنجی بکەن بۆ هیچ کەس
حفظی کەن پەندم لە ناوەند دڵتان

هەر پیاوێکە صەد پیاو دێنێ
چەند خۆشە گەر بن ئێوەش وەك ئەوان

دەڵێن جام بشکێ بەڵام نەزرنگێ
شتی وا مەکەن بشکێ قەدرتان

گۆشتەکەی ڕانتان بخۆن چاکترە
والە مینەتی دەستی قەسابتان

بۆ ژیانێکی پێنج و دوو ڕۆژی
حەیفە بەخۆشی وا نەژی ئینسان

# * بێ ئەدەبی *

بێ ئەدەبی پەرت بووە دەردێکی بێ دەرمانە
نەژین لە ژین خۆشترە لەم زرووف و زەمانە

زەمانە وەها تێک چوو حورمەت هەر ناوی ماوە
سووچی زەمانە نییە بێ ئەدەبی لە باوە!

بە بۆنەی چلەی کۆچ کردنی مامۆستای نەمر علاءالدین سجادی

لە گشتی خاکی کوردستان گوڵانسیسە (چ) قەوماوە
ئەجەل لێی کردەوە یەك گوڵ لە باخچەی خۆشی ئەم ناوە

گەلێ حەیفو مخابن بۆی کە زۆر زوو کۆچی کرد رۆیی
علاءالدینی مامۆستا لە ژێر ئەم خاکە نێژراوە

دەکەم من یادی ئەو کاتەی لە هەولێر کۆ دەبووین گیانا
ئەوەك بیکەم چلەی ئێستا بە ئاگری دڵ کە سووتاوە

قسەو گوفتاری ئەم زاتە هەمووی پەندو نصیحت بوو
کەلامی شیرنی زاری بە عەقل و منطق هۆنراوە

شەوو رۆژ صرفی عومری کرد لە مەکتەب خانەیی علما
بە نووری عیلم و زانستی وەکوو رۆژ شوعلەیی داوە

دڵێکی پڕ بە جۆش و خرۆش لە هەولێر وا بەجێ هێشتوو
ئەوا مزگەوتێ بەم ناوە بە ناو ئەم زاتە لێنراوە

گەلێ مەجووبی مەجلیس بوو قسە و گوفتاری پڕ مەعنا
بە سۆزی دڵ نەماوە خۆی بەڵام ناوی لە دڵ ماوە

ژیانی خۆی هەمووی صەرف کرد لە تەکیە و خانقاو مزگوت
نەبوو تاکی لە دین داری لە مەشرق تاکو ڕۆژئاوا

بە نەصی (کُلُّ نَفسٍ) هەر دڵی خۆت روون بکە (نووری)
نیە چارە دەبێ بمرین بەشەر بەم تەرزە خولقاوە

١٩٨٥/٢/١٤

## دڵ و چاو

عەیش و سەفا لە دڵدا چاو لە غەمت پڕ گرین
لە لایێ بەزم و شادی لە لایێ گریەو شین
جەورو ئەزیەت دڵ دەکێشێ چاو ئەبینێ ماهی ڕووت
نیعمەت و لەززەت لە بۆ چاو غەم لە بۆ دڵ بۆتە قووت

## لەعل

ئەم عەینە چ عەینە کە لە بەینێ جووتی لامە
ئەم پێیە چیە پێیە کە بە ئەم خەتی کەلامە

## من و بولبول

ئەمن و بولبول تا بەیانی وا ئەکەین گریان و زار
ئەو لە بۆ خونچە و منیش بۆ یاری جوانی گولعوزار

# دەوران

گەر لەگەڵ تۆ ڕێك نەكەوت دەوران لەگەڵیا ڕێك كەوە
چونكە زۆر نائەهل و ناكەس دەچن و دێن لەم ناوەوە !

## بالی بوون

مەغروری جوانیت مەبە ئیتر ئەو نازەوا بەس
وا مەزانە جوانی دەوام بكا بۆهیچ كەس

## بۆ شێخ كەریمی شێخ مستەفای «صافی» هیرانی گوتراوە

خاڵە شێخ بۆچی لە دەستمان هەر بە غاردان تۆدەڵاتی
چاوەنۆڕی هاتنت بووین تاكو ئێستا هەر نەهاتی

## ئەمەش هەر بۆ ئەوە

با نەڵێن ئێستا لەگوێی تەنبەڵی کردوە هەڵات
دەنگی خۆشت وا لە پاش خۆت بابمێنێ بۆ وڵات

## وەرگێڕان لە تورکی یەوە(١)

هیچ کەس نی یە بێ کەس بێ  هەرکەسێ ئەیێ کەسێ
بێ کەس ماوم مەدەدکە  ئەی کەسانی بێ کەسێ

## وەرگێڕان لە فارسی یەوە(٢)

خۆشی یی دونیا ژن و ددانە
گەر هەردوو نەبێ دنیا زیندانە !

---

(١) ئەم وەرگێڕانی چوارینێکی ضیا پاشای شاعیری ناوداری تورکە .
(٢) ئەم وەرگێڕدراوی ئەم شیعرە فارسی یەی سەعدی یە :
نعمت دنیا زن و دوندانست  گرهردو نباشد دنیا زیندانست

# دنیاو غەم(٣)

لە دنیادا نی یە هیچ کەس بەبێ غەم
ئەگەر بێت وبێ شێتە وعەقل کەم

### بە عەرەبی

لا یوجد في الكون انسان بلا هم
فان وجد فهو حیوان بلا فهم

### بە تورکی

بو دنیادە غمسز اولان کمسە یوق
اگر وارسە عقلسز در اودە چوق

---

(٣) ئەم دێرە شیعرەش لە فارسی وەرگیراوە .

# قوزیاتی کوردی

★ کوردستان ★

خاکت گوڵ وگوڵستان
گشت فیدای چیاوچۆڵت
دێهات لەگەڵ شارستان

★ نیشتمانم ★

بەهەشتە نیشتمانم
خاکت دوڕڕوگەوهەرە
ڕوح فیدات نیشتمانم

## ○ نووری چاوی ○

بێت ڕوونە نووری چاوی
چاوم چاوە نوڕتە
وەرە تۆی نووری چاوی

●

## ○ چاوەڕوانی ○

چاوم لە چاوەڕوانی
بیستومە یار ئێستا دێ
چاوکەوتە چاوەڕوانی

●

## ○ لەبی یاقووتت ○

قووتە لەبی یاقووتت
یاقووتە وەیا قووتە
لە علی لەبی یاقووتت

○ چاوه‌نۆڕی ○

چاوکه‌وته‌ چاوه‌نۆڕی
وام زانی خه‌ڵات کراوم
چاوی هه‌ڵگرت یار(نۆری)

●

○ بۆت نامێنێ ○

چت هه‌بێ بوت نامێنێ
گه‌ر له‌ ژێر خانوو بکه‌ی
ئاخیری بۆت نامێنێ

●

○ بۆت ده‌مێنێ ○

یه‌ك شتت بۆ ده‌مێنێ
چاکه‌و خێرت کردبێ
هه‌ر ئه‌وت بۆ ده‌مێنێ

# تەنگ و چەڵەمەی دنیا

○ ○

لە ڕۆژی ئەوەللا خۆزیا نە باما من لە دایە
منی نەی خستبایە ناو غەمی ئەوجیزە دنیایە

●

کەچ ناکەم ملم من لە بۆ قوتێکی ژیانم
پاقلاوە نەبێ با بلا هەرزن بێ نانم

●

هەرکەسێ هەیبێ ئارد لە گەڵ داری
شوکرانەی بیا بۆ زاتی باری

●

یەکێ فەرمانی بەرزتر بێ لە سەر فەرمانبەری تودا
ئەگەر بیلێم بە فیرعەون خۆی دەکا یاخو بە شەددادا

○ هەژاری ○

بۆچی ئیشی ناشەنازی کردووە وا احتیاج
گشتی دەرگای داخرا لێی غەیری دەرگاهی خودا

بێ حورمەتی ئەم زەمانە ○

عەیب لە زەمانە دەگرن لە خۆمانە عەیبەکە
گەورەیی چۆن دەمێنی ڕێزت نەبێ لای گچکە !

●

شێخ عەبدوڵلای شێخ مستەفای
نەقشبەندی ئەم دێڕە شیعرەی بۆ شێخ جەلال
نووسیوە دوای ناردنی دانەیەک لە چاپی یەکەم لە دیوانەکەی بۆی

دیاریت (بەند) ە جا ئەوها سوپاست بابکەم نووری
بۆیژ هەردەم لە دیوانە لە نێزیکی وەکوو دووری

●

نووری ئەم دێڕەی بۆ خوالێخۆش بوو مەلا مەحموودی
بێخود گوتووە ..

هەموو دێڕ و گەوهەر بارە کەلامی شیرنی بێخود
بە ئوستادی غەزەل مەشهوورە ئوستادم مەلامەحموود

ژیانی خوّم بە ئەزیەت و میحنە تا رابوارد هەتا مانم
لە ژێر ئەم خاکە ئێستا چاوە نوڕی لوطفی یەزدانم

●

والە وێنەم کەیف دەبارێ تێ بفکرن ئێوە وورد
خوّ نەمردم من کە دیتم حوکمی زاتی قەومی کورد

●

هەتا مردن ئەگەر نەمری ژیانی سەربەخوّییان
بە خوێنی دڵ بنووسری والە دەست چوومافی کوردستان

## نیشتمان

ناموی نیشتمان فەرزی محال بشمری حەتتا
ناتوانی گیتی هەلگری ئەم تەرمە عەزیمە!

●

## ئاموّژگاری شێخی سەعدی

قایمە زوّر کوّلەکەی دین چونکە ئێوەن پشتیوان
ترس و لەرز نابێ لە گێژەی گەر ببێ نوح کەشتیوان

## جەژنە پیرۆزە بۆ
## یەکێتی ی نووسەرانی کورد/لقی هەولێر

سوپاسێتان دەکەم نووسەرانی کورد
زانایی ئێوە هەولێری پڕکرد

هیوادارم وا هەر ساڵ جەژنەمان
بە کەیف خۆشی بێتەوە بۆمان

بە کوردو عەرەب گەلی عیراقمان
بژین بە خۆشی تا ئاخیر زەمان

●

○ ووتەی دوکتور فوئاد ○

کێیە کە دەکا مەنعی مە لەم خاکە پیرۆزە
میراتی باب و باپیرە هەر بۆمە ماوە

کوردی کورد ستان لە گەڵ یەك شەڕ دەکەن
میللەتی بەد بەختی مەزلووم ئێوە میرات بەش دەکەن ؟

○ مەغرووری جوانی ○

هەنده غرووری حوسنی کەم مابیم بێ نەفەس
جوانی تا ئەبەد دەوام ناکا بۆ هیچ کەس

●

جیسم و جانانی شیرینی ئەو گوڵانی ماهی ڕووت
هەر ئەوانن داخەکەی من بۆ گوڵان وا بوونە قووت

●

هەموو دنیا ئەگەر بێت و بیێتە ماڵ و موڵکی من
غەمم نابڕوا لە دڵ چونکە بە غەم شێلراوە طینی من

●

ئەگەر بێتو بکا تەحقیری مەجلیس واکەسێ ناکەس
بە قەوچە قەوچی ئەو دەنی یە کە تەحقیر نابێ هیچ کەس

●

سعید یحیی خطاط
ئەم دیوانەی نووسیوەتەوە وسەرپەرشتی لەچاپدانی
کردووە

نرخی ( ٥٠٠ ) فلسە

ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی نیشتمانی ( ٨٨٦ ) سالی ١٩٨٥

چاپخانەی رۆشنبیریو لاوان / هەولێر

ت ٢٤٦٥٨

# دیوان نوری

## الشیخ جلال الشیخ جمیل النقشبندي

مِن مطبوعات الامانة العامة للثقافة والشباب

نرخی ( ٥٠٠ ) فلسە

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی ( ٨٨٦ ) سالی ١٩٨٥

چاپخانەی رۆشنبیریو لاوان / هەولێـر

ت ٢٤٦٥٨